# باوەگوڕگوڕ مناڵانی

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

ژمارەی ٧٠ ئەیلولی ٢٠٠٩



گۆوارێکی مانگانەی منداڵانە لە دەزگای
ڕۆشنبیریی شەفەق دەردەچێت

بۆ تەمەنی ٦ تا ٩ ساڵان

پەروەر

منالانی
باوەگورگور

ژمارە
٧٠
ئەیلول
٢٠٠٩



خاوەنی ئیمتیاز
بەدران ئەحمەد حەبیب

بەرپرسی ئەنجومەنی کارگێڕی
ئەحمەد تاقانە



سەرنووسیار
محەمەد سەعید زەنگنە



ڕاوێژکار
ڕێواس ئەحمەد

بەڕێوەبەری هونەری و نەخشەسازی
پەروەر

نیگار
گۆران قادر
نەجات شوانی




07701492911



بۆ تەمەنی ٦ تا ٩ ساڵان





# منالانی باوەگورگور









لە دەزگای ڕۆشنبیری شەفەق دەردەچێت

سەرنووسیار
hamatal_z@yahoo.com
07701310542

ناونیشان :
کوردستان - کەرکووک
خولگەی ئەحمەدی خانی



## ئازیزەکانم ....

ئێستاش یەکەم ڕۆژی کارکردنم لە گۆوارە خنجیلەکەتانم لە بیرە ، پێش چەند ساڵێک ، وەک هاوکارێک کارم بۆ دەکردن و جار بە جار ، وێنەم بۆ بابەتە شیرینەکانی باوەگورگور دەکێشا و ئێوەی ئازیزم دلخۆش دەکرد . بەڵام ئەوەی ئێوەی ئازیز نایزانن ! کە من وەکو ئێوە بووم ، ئەوسا بە چاکی نەمدەزانی چۆن وێنە بکێشم بۆ ئێوەی خۆشەویست .

وێنە کێشانم وردە وردە لە گەڵ ئێوەدا بچوک دەبوونەوە و تا بوو بە هاوڕێی مانگانەتان و ، ئەوەندە خۆشی دەوێن ، کە ئیدی کەم جار کاتی ئەوەم هەیە وێنە بۆ گەورەکان بکێشم کە کاری سەرەکی خۆمە . کاتێکیش دیزاینی ڕووپەڕەکانی گۆوارەکەم گرتە ئەستۆ تەنها شتێکم مەبەست بوو ، ئەویش ئەوە بوو کە ئێوەی زێدە خۆشەویست شایستەی گۆوارێکی جوانتر و ڕەنگاوڕەنگترن ، هاوشێوەی جوانیی ئێوە .

هاوڕێتان

یەروەر

# سابوون

ئیلاف فوئاد تاهیر



من سابوونی بۆنخۆشم
ئاگادار بن منداڵان
بۆ پاک کردنەوەی دەستان
هەروەها بۆ خۆشووشتن
ئەوەی بە کارم بێنێ

بۆ ژیان زۆر پێویستم
میکرۆب دەکوژم بۆتان
لە پێش نان و لە پاش نان
بە کاردێم بۆ جل شوشتن
ڕەنگە میکرۆب نەبینێ

# هیوای ژینم

محەمەد عەبدولکەریم ڕەزا



دایە دایەی شیرینم
لە یادت ناکەم دایە
شەوانە کە ڕاتژەندوم
زانست ڕەوشت بیری جوان
هیواو ئاواتی ژینم

تۆی هەماهەنگی ژینم
بزە و خۆشی و لای لایە
پێت نەوتوومە ماندوم
لە تۆ فێربووم دایە گیان
تۆی ئەی دایەی شیرینم



# پرسیارەکانی سمۆرە

ڕێواس

سمۆرە زۆر تینووی بوو، بازیدایە خوارەوە. وتی" خۆزگە لە نزیک ئەم دارەوە کانییەک هەڵدەقوڵی، ئیتر پێویستی نەدەکرد وا دوور بڕۆم بۆ ئاوخواردنەوە. هاوڕێ نازانم بۆ ئاو هێندە پێوستە، نازانم بۆ ناتوانیین بەبێ ئاو بژین؟."

_ ئێ وایە، هیچ زیندەوەرێک بەبێ ئاو ناتوانێ بژی. لە سەر زۆربەی ئەستێرەکان ژیان نییە، لەبەرئەوەی ئاوی تێدا نییە. ئەم ڕاستیانە گرنگی ئاومان بۆ دەردەخەن. ئاو دوو لەسەر سێی ڕووبەری زەوی پێکدێنێ. 70 ٪ لەشی ئێمە ئاوە.

مرۆڤ دەتوانێ تەنیا سێ تا شەش ڕۆژ بەبێ ئاو بژی. خۆ گەر لە شوێنێکی زۆر گەرمیشدا بێ، ئەوا لەوانەیە تەنیا دوو ڕۆژ بتوانێ بەبێ ئاو بژی. هەریەک لە ئێمە ڕۆژانە دەبێت بە لایەنی کەمەوە دوو لیتر ئاو بخۆینەوە. بەشێکی زۆری ئەو ئاوەی دەیخۆینەوە. لە ڕێگەی میزو پیسایی و ئارەقەوە لە لەشمان دەردەچێتە دەرەوە.

ئاو لە سووڕانەوەیەکی بەردەوامدایە. بە هۆی گەرمی هەتاوەوە ئاو دەبێت بە هەڵم، هەڵمەکە لە ئاسماندا هەور دروست دەکات. هەور دەبێت بە بەفرو باران و تەرزە. هەمان ڕێژەی ئاو کە بوو بە هەڵم، بۆ زەوی دەگەڕێتەوە. بەشێکی تێکەڵ بە ئاوی دەریاو ڕووبارو ئۆقیانووسەکان دەبێ و بە شێکی تری زەوی هەڵیدەمژێ. بەڵان ئەم ئاوە لەناو زەویدا نامێنێتەوە، بەڵکو لە ڕێگای تەقینەوەی کانیاوەکاندا جارێکی تر تێکەڵ بە ئاوی سەر زەوی دەبێتەوە.

# شەهێن

شالاو ئەمین



ناسراو و بەهێز و پڕ جووڵەترین جۆرەکانی هەڵۆیە . بەرگەی برسێتی زۆر و تێربوونی تەواو ناگرێت ، تا بەتەمەندا بچێت زووتر تووڕە دەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر بەنەرمی مامەڵەی لەتەک بکرێت ، توانای فێربوون و مەشق پێکردنی هەیە. شەهێن چەند ڕەنگێکی هەیە وەک سادە ڕەش، سەر ڕەشی سینگ و پشت سپی و ڕەش، سوری سەر سپی، ئەرخەوانی باڵ ئاڵتونی لەش داپۆشراوە بەخاڵی سپی.شەهێن باڵندەیەکی کۆچەرە ، لە مانگی سـپتەمبەر بەرەو شوێنە گەرمەکان کۆچدەکات و لە مانـگی مارس و ئەپریلدا دەگەڕێتەوە . قۆناغی کرکەوتن دەست پێدەکات ، نزیکەی (2-6) هێلـکە دەکات و دایکـەو باوکە بۆ ماوەی 6 هەفتە بەنۆرە لەسەری هەڵدەنیشن . مێیەکانیان لە نێرە گەورەترە .باشترین جۆرەکانی ئەوەیە کە:

چـاوی قاوەیی و گەردنی تیژ و درێژ و ڕیــشی پڕو ، قاچــی کوڵ و باڵی درێژ و کلکی کوڵ و پەڕی کەم و نەرمبێت .

# زمانی بۆق

چیمەن کەرکووکی



زمانی بۆق ماددەیەکی لینجی هەیە ، بە ئاسانی دەتوانێ نێچیرەکەی بگرێ و قووتی بدات . دواتر زمانی بۆق پێچـەوانەی زمانــی مرۆڤـە . چونکە زمانی بۆق لە پێشـــەوە گەیشتووە بەیەک ، زۆر بە ئاسانی و بە زووترین کات دەری دێنێ و نێچیرەکەی دەخوات .

# یاری کۆلارە

لە فارسییەوە : ئەنوەر چاورەش
سەرچاوە : ئەنتەرنێت



ڕۆژێکی وەرزی پاییـز بوو بایەکی نیمچە توندی دەهات ، سەگە بچکۆلە ، ڕۆیشتە دەرەوە بۆ ئەوەی کۆلارەکەی بفڕێـنێ ، سەگە بچکـۆلە لەگەڵ کۆلارەکەیدا سەرەو بان و هەڵدێر غاری دەدا ، هەوڵی دەدا کە کۆلارەکەی بەرەو بان بفڕێنێ، لەناکاودا بایەکی توند هەڵی کردو کۆلارەکەی لەگەڵ خۆیدا برد .



سەگـە بچکۆلە بە غەمبارییـەوە وتی : تەماشـا ، چ بایەکی تونـــدە ، کۆلارەکەی کەوتە ســەر دارێک و گیری کرد . ســەگە بچـکۆلە تەماشـــای کۆلارەکەی کرد وتی : ئێ خۆ من ناتوانم بڕۆمـە بان ئەم دارە ، ئای ئیدی ناتـــوانم چیتر کۆلارەکەم بفڕێنم .



سەگە بچـکۆلە بەرەو ماڵ کەوتــە ڕێ و هەندێک غەمبار بوو ، بایەکە گـــەڵاکانی دەوری ئـــەوی ئە جوڵانەوە ، گەڵاکان ســـور ، زەرد ، ســـەوز و نارنجی بوون . سەگە بچـکۆلە لەگەڵ خۆیدا وتی : ئێستا یارییەکی دیکە دەکەم ، گەڵاکان لە ئاسمان ئەگرمەوە ، بەڵام ئەمە کارێکی ئاسان نەبوو ، وەکو بیری لێدەکردەوە .



لە ناکاو شـتێک بەرەو رووی هـــات ، کاتێک تەماشـــــای ســـەرەوەی کرد ، بینی شـــتێکی گەورە و ڕەش لە بـــان سەریەوە بە ئاسماندا دەجولێتەوە ، ئەوە گەڵای دارنەبوو ، چونکە گەورەتر بوو ، ئەی ئەوە چی بوو ؟



ئەو شتە بەرەو خوار هاتو هات ، کەوتە بان سەری سەگە بچکۆلە و بەردەم چاوی گرت . نایتوانی هیچ جێگایەک ببینێ ، گوێی لە دەنگێک بوو ، کە ئەی وت : زۆر زۆر باشە ، کلاوەکەم وا لێرەیە .



سەگە بچکۆلە کڵاوەکەی لەسەر دەرهاوردو دای بە مام کەنغەر ، مام کەنغەر وتی : سوپاست دەکەم تۆ باشترین کڵاوی منت لەدەست با رزگار کرد . سەگە بچکۆلە وتی : من کارێکم ئەنجام نەداوە . مام کەنغەر وتی : خۆزگە منیش بمتوانیایە ، کارێکت بۆ ئەنجام بدەم .



سەگە بچکۆلە وتی: کۆلارەکەم کەوتووەتە بان ئەو دارە ، ئەتوانی بۆم بێنیتە خوارەوە ؟ مام کەنغەر وتی : هەڵبەتە ، دەتوانم ، بەرەو بان خۆی هەڵداو کۆلارەکەی هاوردە خوارەوە . سەگە بچکۆلە وتی : ئای چەند خۆشە ، من زۆر خۆشحاڵم کەکلاوەکەت کەوتە بان سەرم .



کۆلارەکەی سەگە بچکۆلە جارێکی دی لەئاسمان دەستی بە فڕین کرد . سەگە بچکۆلە وتی : زۆر سوپاس مام کەنغەر . بەڵام مام کەنغەر گوێی لێ نەبوو ، چونکە دوور کەوت بوو .



# وێنەی چۆلەکە

چیرۆک : لەتیف هەڵمەت
نیگار : فەرەیدون هاوار

شەوێک لە شەوان ، نواڵە بە قەڵەمێکی ڕەنگاورەنگ ، وێنەی دار توویەکی کێشاو بە بۆیەی قاوەیی، هێلانە چۆلەکەیەکی لەسەر دروست کرد. ئنجا چۆلەکەیەکی دایکانە و چۆلەکەیەکی باوکانەی لەگەڵ دوو زەرنەقوتەدا لە ناو هێلانەکەدا بە بە قەڵەمەکەی نەخشاند .

نواڵە دوای تەواوبوونی وێنەکە ماندوو بوو ، ویستی قەڵەم و درەختەکەی لەسەر مێزەکەی تەنیشت خۆیەوە دابنێ و بنوێ.لەپڕ چۆلەکە دایکانەکە بانگی لە نواڵە کرد و پێی گوت :

کچۆڵەی جوان ، بەر لەوەی بنووی تفەنگێ بە لقی درەختەکەوە هەڵواسە .

نواڵە بەسەرسوڕمانێکی زۆرەوە بە چۆلەکەکەی گوت:

ئەی چۆلەکە میهرەبانەکە ، تفەنگت بۆ چییە ؟

چۆلەکەکە بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی :

ئەی خانمە بچکۆلەکە زووکە ، زوو ، تفەنگێک بەلقێکی نزیک هێلانەکەمدا هەڵواسە ، ئەگەر تفەنگم نەبێ بەچی هێلانەکەم و درەختەکە و بەچکەکانم و خۆم لە تەوری داربڕ و تاپڕی ڕاوچییە دڵڕەقەکان بپارێزم . . .؟



# نەعنا

پەلکە نەعنا ، بۆ خۆشکردنی تامی خواردن و چای ، بەکاردەهێنرێت کە بۆن و تامێکی خۆشی پێ دەبەخشێ . هەروەها بۆ هێور کردنەوەی حالەتی دەروونی و بەهێز کردنی گەدە باشەو ، هەرسکردنی خواردن ئاسان دەکات . ئاوی نەعنا بۆ ترپە و لێدانی دڵ بەسوودە. لە هەمان کاتــدا نەعنا پەیوەندییـەکی بەهێزی لەگەڵ دڵ و دەروون ، وەکو ئەندامی هەرس کردن هەیە ، پاشـان غەرغــەرە بە ئاوی نەعنا بۆ چاکبوونەوەی پووکی ددان بەسوودە . دواجار ئارەقە لە جەستەی مرۆڤ کەم دەکات و بۆنی دەم خۆش دەکات .

ئا: سازان





## ئازیزان : ئایا دەزانن ؟

ئەو ئاوەی رۆژانە بەکاری دێنین، چۆن و بەچ شێوەیەک دەستمان دەکەوێ؟ ئایا تێبینیت کردووە، کاتێک بەیانیان دەست و دەم و چاوت دەشـۆی و ئاوەکەت کردۆتەوە، پاشـان دانەکانت دەشۆیت و قژەکەت شانە دەکەیت ، ئاوەکەش بێ سـوود دەروات ؟ بروانە ئەگەر رۆژی دوو ملیۆن منداڵ بەم شێوەیە ئاو بەفیرۆ بدەن ، ئەوکاتە دەزانی چەنێ ئاومان بەبێ سوود دەروات . بۆیە دەبێ خۆتان و هاورێکانتان فێربکەن ، ئەو ئاوە بەفیرۆ نەدەن و دەستتان پێوەی بێت.

ئا نازەنین



دەمەوێ هەندێ زانیاریتان دەربارەی زیرەکی مێرووله بدەمێ، بۆ ئەوەی ئێوەش وەکو ئەوان زیرەک و ئازا بن ، چونکە ئەگەر بیر لە زیرەکی مێرووله بکەینەوە ، ئەوا تووشی سەرسوورمان دەبین.ئازیزان: مێرووله توانایەکی زۆری هەیە بۆ دۆزینەوەی رێگای ماڵەکەی، هەرچەند لێی دوور کەوێتەوە. هەروەها جۆرە مێروولەیەک هەیە، لە چۆڵەوانییە، ئەم جۆرە مێروولەیە ، رێگایەکی دوور و درێژ دەبرێ ، بۆ پەیداکردنی خۆراک ، پاشـــان بە هەمان شوێنی خۆیدا بۆ ماڵەکەی دەگەرێتەوە ، بێ ئەوەی رێگای لێ ون بێت ، ئەمەش بەهۆی پێیەکانی کە وەکو قیبلەنامە رێــگای دووری پێ نیشان دەدات .

# مێرووڵەی ژیر و ئازا

دایکی مینا

## داڵ بەرد بۆ شکاندنی هێلکەی وشترمەل بەکار دێنێت



هێلکەی وشترمەل لای داڵی میسری بە بەتامترین ژەم دادەنرێت ، بەڵام گرفتی ئەوەیە هێلکەی وشـترمەل ، تا بڵێی رەق و قایمە ، تا ئەو رادەیەی کەسـێک لەسەری دانیشێت ناشـکێت ، لەمەوە داڵ بە سەلیقەی خۆی بە دەنووکی بەرد هەڵدەگرێت و بە هێلـکەکەیدا دەدات ، ئەمەش بە جارێک نابێت ، بەڵکو دەبێ چەندین جار پێیدا بکێشێت ، ئینجا دەشـکێت. هێلکەیەکی وشـــترمەل هێندەی 24 هێلکە مریشک دەبێت.

و: هەوری عەبدوڵڵا



ئامێری کۆمپیوتەر لە چوار پارچەی سەرەکی پێکهاتووە و چەند پارچەیەکی لاوەکی...

پارچە سەرەکییەکان :

1 کەیس .

2 مۆنیتەر .

3 ماو



(کەیس)، گرنگترین

پارچە پێویستەکانی لە

ناو ئەم سنووقە ... ەرەکیترین بەشەکانی

ئەم ئامێرەیە.

ئا بەهرە



# ئامۆژگاری

نیگار : گۆران

ئا نازە

چی دەکەیت کاتێ دڵۆپێک مەرەکەب لە دەستت دەرژێتە سەر فەرشەکەت ؟ دەبێ فەرشەکە یەکسەر وشک بکەیتەوە ، دوای ئەمە کەمێ خوێ بکە ســـەر ئەو شوێنەی مەرەکەبەکەی بە سەردا ڕژاوە ، دوایی ئەو خوێیە بە فڵـچە هەڵگرە ، دەبینین خوێیەکە زۆرترین مەرەکەبی بۆ خۆی ڕاکێشـاوە ، دەتـوانی ئەم کارە چــەندین جار دووبارە بکەیتەوە ، دوای ئەوە شوێن مەرەکەبەکە بە ئاو و سابون بشۆ و لێی گەڕێ شوێنی مەرەکەبەکە وشک بێتەوە .

# دیمانە

ئا خەیار جوتیار

کانی کچێکی ڕووخۆشی زیتەڵەیە، تەمەنی چوارساڵانە، بەنیازە ئەم ساڵ بچێتە باخچەی ساوایان، هەموو پیتە کوردی و عەرەبی و ئینگلیزییەکانی لە بەرە.




- خۆت بناسێنە ؟
- کانی شەهاب شێخ تەیب.
- ماڵتان لە کوێیە ؟
- ئێمە لە شاری کۆیە دادەنیشین .
- پێشتر لەکوێ بوون ؟
- ئێمە جاران لە بەغدا بووین ، باوکم گوێزرایەوە بۆ زانکۆی کۆیە ، ئێمەش لە گەڵی هاتین .
- ئەی ئێوە خەڵکی کەرکووک نین؟ با ! باوکم کەرکووکییە .
- کانی تۆ ئارەزووت لە چییە ؟ من وێنە دەکێشم و حەزم لە کۆمپیوتەرە .
- منالانی باوەگوڕگوڕت دیوە ؟ بەڵێ باوکم بۆم دەکڕێ .

# ئایا دەزانی؟

## بۆ زاخاوی مێشك

- ڤیتامین C لە هەموو سەوزەیەکدا هەیە.
- وڵاتی میسر یەکەمین وڵات بوو پەتاتەی چاند.
- بە تەمەنترین گیاندار کیسەڵە.
- بۆق گەرا دەکات. سکی نابێت.
- کۆرپەلە لە ناوکەوە خواردنی بۆ دەڕوات.

ئا کوردستان محەمەد

## بەم وشەکەلە ئەم پەندانە تەواو بکە؟

دڕۆ، چەم، کێشان، مار، ساڵ

- چاوی.........دەردێنێ.
- ..........بێ چەقەڵ نابێ.
- چرای.......بێ شەوقە.
- دان کێشان و گیان.........
- ساڵ بە..........خۆزگەم بە پار.

## هەڵێنە

- سپییە مەلا نییە، زەردە حاجی نییە، کەسکە سەید نییە
- سەری گەورەترە لە ورگی
- سێ یاریکەر و دوانزە سەیکەر
- لە داری چیا، لە مووی بزن، ئافەرین ژن
- لە ئاورێشم لووسترە لە باڵندە خێراترە

## وشەی بزر

ئا داستان

| | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ک | و | ر | د | ن | ی | ا | م | ا | ن |
| ل | ا | و | ە | ن | د | د | ا | ن | ا |
| ە | ک | ا | ر | ز | ا | ن | ک | ش | پ |
| ە | ە | ە | ت | ب | ە | ز | ۆ | ی | ە |
| ڵ | ا | ە | و | ە | ی | ا | ڤ | ڤ | ی |
| م | و | ر | ا | ر | و | ن | ا | ا | و |
| ە | ڕ | ێ | ن | ێ | ا | ا | ن | ن | ە |
| ت | ێ | ز | ا | ز | ل | ا | ز | ۆ | ن |
| ک | ا | و | ە | ە | ە | ر | ێ | م | د |
| س | ە | ر | ب | ە | س | ت | ا | ڵ | ن |

دوای ئەوەی ئەم ناوە کوردییانە کوێر دەکەیتەوە وشەیەکتان بۆ دەمێنێتەوە لە شەش پیتان پێکهاتووە کە بە مانای ئێوەی خۆشەویست دێت .

سەربەست ، کوردنیا ، لاوەند ، هەڵمەت ، کارزان ، هاورێ ، هەرێز توانا ، بەرێز ، هیوا ، زانا ، دانا ، کۆڤـان ، شـیڤان ، پەیوەند ، لازۆ ، هەرێم ، کاوە .




## خۆشەویستەکانم

کۆی ئەم پیتە بڵاوانە ، ناوی گەلییەک لە گەلییەکانی ناوچەی هەورامانمان دەستدەکەوێ ، کە یەکەم پیتی ( ز ) . ئەم گەلییە 15 کیلۆمەتر لە خورماڵەوە دوورە ، سەر بە ئەحمەد ئاوایە . لە نزیک سەرچاوەی ئەم گەلییە ، چەند ئەشکەوتێک بەدی دەکرێ ، گەر زانیت ناوی چییە لە ژێر دارەکە ناوی بنووسە لە ناو لاکێشەکە

ئا فەرید زەنگنە

# پێبکەنە تا جوانتر بیت !

قوتابییەکی قوناغی بنەرەتی لە ژێر درەختێکدا، کتێب دەخوێنێتەوە، چۆلەکەیەک ریقنەیەک دەکات و، دەکەوێتە سەر پەڕەی کتێبەکە، قوتابییەکە سەر هەڵدەبڕێت و دەڵێت: دەک بە نەفرەت بی، ئەگەر دایکت نەختۆکەیەک شەرمی بە خۆی بوایە، ئەوا دەرپێیەکی دەکردە پێت.

میران جەمال – کانی شەیتان

ئا کۆڕین




ناوی تەواوی یونس ڕەووفە، خاوەنی سروودی نەتەوەیی ئەی ڕەقیبە، ئەگەر ئەو پیتانەی ستوونی یەکەم بە ڕێگەی ئەو هێڵانە بگەیەنیتە ستوونەکەی بەرانبەر ناوەکەیت بە ستوونی لا ئاشکرا دەبێت.

ئا دەریا

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| 1 | 4 | 5 | 3 | 6 | 2 |
| 2 | 4 | 6 | 4 | 5 | 1 |
| 5 | 1 | 2 | 6 | 4 | 3 |
| 3 | 6 | 4 | 1 | 2 | 5 |
| 6 | 5 | 3 | 2 | 1 | 3 |
| 4 | 2 | 1 | 5 | 3 | 6 |

لە نێوان ئەم 36 چوار گۆشەیە دوو ژمارە جێگۆڕکێان پێکە کە ئەنجامەکان بە هەر چوار لادا بکاتە 21.



## ١٠ جیاوازی بدۆزەرەوە

ئا ماکوان



ئا ئاریان

سێبەری ئەم ئەسپە بدۆزەوە و بازنەیەکی بە دەوردا بکێشە!






جێگۆڕکێ بە یەک دەنکە شقارتە بکە تا ئەنجامی هاوکێشەکە بکاتە 4.

ئا ڕۆژ دلێر



ئ شەیدا

ئەم هەژدیهایە چەند جۆر شتی خواردووە؟

هەوت شتی خواردوە.





پارچەی ئەم وێنەیە بدۆزەوە

ئا شیلان



ئ شوانی

لە ناو ئەم باڵندە و پەلەوەرانە تەنیا یەکێکیان گۆشت خۆرە؟



ئەم گیانلەبەرانە بەرەو
ماڵەکەی خۆیان
بگەیەنە

| | |
|---|---|
| شێر | کوورە |
| چۆلەکە | شار |
| مێرووولە | پشتیر |
| مانگا | بێشە |
| هەنگ | هێلانە |

ئا هەرێم

بیگەیەنە شارەزا نییە!

ئا شوانی

کەمۆکەیەک بیربکەرەوە

دوو باوک و دوو کور دەچنە چێشتخانەیەک بۆ نان خواردن ، سێ قاپ خواردنیان بۆ دێت کەچی هەر یەکەو قاپێکی بەردەکەوێ .

ناسکە محەمەد

# هاوڕێیانی منالانی باوەگوڕگوڕ























**چیا سامان**
12 ساڵ







**پروشە شەماڵ**
4 ساڵ



گ

خەندەزار

**ئەم فۆرمـــــە چێبکە بە مەرجێک دووبارە بە سەر هێڵە کاندانە نەگەڕەیتەوە !**